# پێشەکی

**الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد:**

**زانستی تەوحید گەورەترین و بەرێزترین زانستە و هەروەها یەکەم زانستە لەسەرمان کە دەبێت فێری بین وکاری پێ بکەین، یەکێکیش لەسێ جۆرەکەی زانستی تەوحید بریتیە لە تەوحیدی (الأسماء والصفات) ئەوتەوحیدەی کە بریتیە لە ناسینی الله تعالی بە ناوە جوانەکانی وصیفەتە بەرزەکانی، ئەو کەسەی جاهیل بێت بەم تەوحیدە ئەوا جاهیلە بە الله تعالی، هەرلە سەردەمی سەلەفەوە تاکو ئێستا زۆرترین کۆمەڵە توشی کوفروزەندەقە وئیلحاد بوونە لە ناوە جوانەکان وصیفەتە بەرزەکانی الله تعالی، وە بەهۆی نەبوونی حوکمی الله لەسەر زەویدا و بڵاوبوونەوەی عەلمانیەت و دیموکراسی و جۆرەها کوفری تر موسڵمانانی ئەم سەردەمە تەواوی هەوڵی خۆیان چڕکردۆتەوە بۆ ڕوونکردنەوەی جۆرەکانی کوفر و شیرکی سەردەم، بۆیە وەکو پێویست ناپڕژێنە سەر ئەوەی کە گرنگی بە تەوحیدی (الأسماء والصفات) بدەن و بیخوێنن و بڵاوی بکەنەوە، منیش لەبەر گرنگی زانستەکە کە جۆرێکە لەسێ جۆرەکەی تەوحید هەروەها لەبەرتیشک نەخستە سەری و بڵاونەکردنەوەی وەک پێویست و هەبوونی جەهلێکی زۆر تیایدا لەلایەن موسڵمان، بەپێویستم زانی عەقیدەی ئەهلی سوننە دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالی کۆبکەمەوە، کە لەسەردەمی نوێدا لەلایەن زانایان بە قاعیدەکان ناسراوە، گرنگی زانینی ئەم قاعیدانە لەوەدایە کە موسڵمان دەزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ صیفەتەکانی الله تعالی دا بکات، ئیتر هەر صیفەتێکی بینی کە هاتبوو لە قورئان و فەرموودەی صەحیحدا بەگوێرەی ئەم قاعیدانە مامەڵەی لەگەڵ ئەکات، ئەوکۆمەڵانەی کە توشی کوفرو ئیلحاد بوون لەم بابەتەدا بەهۆی پێنەگەیشتنی دەقە شەرعیەکان نەبوو چونکە تەواوی قورئان وزۆربەی فەرموودەکانیان پێگەیشتبوو دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالی، بەڵام بەهۆی نەچەسپانی ئەم قاعیدانە لەلایەن کە بریتیە لە عەقیدەی سەلەفی صالحی ئوممەت توشی کوفر بوون.**

# چەند ڕوونکردنەوەیەک

١. بەهۆی تێنەگەیشتن و زانست نەبوون دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالى، تەنها قاعیدەی صیفەتەکانی الله تعالى-م کۆکردۆتەوە نەوەک قاعیدەی ناوە جوانەکانی، چونکە زیاتر موسڵمانان کێشەیان لە صیفاتدا هەیە نەوەک لە الأسماء، بەڵام لە چوارچێوەی قاعیدەکانی صیفاتدا داخیلی هەندێک قاعیدەی ناوە جوانەکانیش دەبین چونکە پەیوەندییان هەیە بەیەکەوە.

٢. قاعیدەکانی الأسماء والصفات بریتیە لە عەقیدەی سەلەفی صالح، شتێک نیە زانایەک بە ئیجتیهادی خۆی نوسیبێتی و دواتر خەڵکیش لەو زانایەی وەرگرن و بڵاوی بکەنەوە، هەروەک چۆن سێ بەشەکەی تەوحید لەلای سەلەف ناویان نەهاتووە بەم شێوازەی ئێستا ئێمە دەیخوێنین بەڵام بە عەقیدە لایان چەسپابوو ئەگەرچی هەمان دەستەواژەی ئێمە بەکارنەهێنن، بەهەمان شێوە ئەم قاعیدانەش بریتین لە عەقیدەی سەلەف ئەگەرچی نەیان نوسی بێت و هەمان دەستەواژەی ئێمەیان بەکارنەهێنابێت.

٣. قاعیدەکانی الأسماء والصفات ناتوانرێ بەژمارەیەکی دیاریکراو دەست نیشان بکرێت، بەپێی ئەو کەسەی دەینوسێتەوە ژمارەی خاڵەکان دەگۆڕێت، کەسێک دوو قاعیدە لەیەک خاڵدا دەنوسیت، کەسێکی تر یەک قاعیدە لە دوو خاڵی جیاوازدا دەنوسێت.

٤. ئەوەی هەندێک زانا نوسیویانە دەربارەی قاعیدەکانی صیفات هەندێکیانم باس نەکردووە وەک دابەشکردنی صیفاتی الله بۆ صیفاتی ثبوتي و سلبي، یان دابەشکردنی فعلەکانی الله بۆ فعلی لازم و متعدي، لەهەمان کاتدا هەندێک قاعیدەم نوسیوە کە لەهەندێک کتێبی تایبەت بەم بابەتە نەنوسراوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نوسەر هەندێک خاڵ بەلایەوە زۆر ڕوونە باسی ناکات یان نایەوێت لە چوارچێوەی قاعیدەکان باسی بکات، مانای ئەوە نیە کە زانایانی ئەهلی سوننە خیلافیان هەبێت دەربارەی، وە ئاماژەم بەو کتێبانە نەداوە کە باسی ئەم قاعیدانەیان کردووە تاکو خوێنەر واتێنەگات ئەم

زانایانه نوسیویانه و دایانهێناوه پێشتر بوونی نەبووه، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی قاعیدەکان لەهەردوو کتێبی ابن تیمیة (مجموع الفتاوى) و (التدمرية) هاتووه، وه بەشێوەی سەرەکی سوودم بینیوه له کتێبی (صفات الله عز وجل الواردة في الكتاب والسنة) له نوسینی (علوي بن عبدالقادر السقاف) وه بەپێی ئەم کتێبه ڕیزبەندی قاعیدەکانم داناوه.

# قاعیدەکانی صیفات

## ➢ قاعیدەی یەکەم:

إثبات کردنی ئەو ناو و صیفەتانەی کە الله تعالی إثباتی کردووە بۆخۆی لە قورئانی پیرۆزدا یان پێغەمبەرەکی صلی الله علیه وسلم إثباتی کردووە بۆی لە فەرموودەی صەحیحدا یان هاوەڵان رضي الله عنهم إثبات-یان کردووە بۆی لە ئەثەری صەحیحدا، بەبێ تعطیل و تحریف(تأویل) و تکییف و تمثیل(تشبیه).

چونکە الله تعالی خۆی زاناترینە بەخودی خۆی، وە پێغەمبەرەکەی زاناترین مەخلوقە بە الله، وە هاوەڵانی پێغەمبەر زاناترین کەسی ئوممەتن بە الله. شتێک لە پێغەمبەرەوە نەیبیستن لەخۆیانەوە إثباتی ناکەن بۆ الله، وە بابەتی الأسماء والصفات تەوقیفیە جێگای ئیجتیهاد نیە بۆیە ئەوەی لە هاوەڵانەوە بە صەحیحی هاتبێ إثباتی ئەکەین بۆ الله تعالی.

تعطیل: واتە پەکخستن و نەفیکردنی صیفەتەکە.

تحریف: واتە گۆڕینی مانای زاهیری صیفەتەکە بۆ مانایەکی تر.

تکییف: واتە باسکردنی چۆنیەتی صیفەتەکە.

تمثیل: واتە شوبهاندنی صیفەتی الله بە صیفەتی مەخلوقەکانی.

لەکاتی إثبات کردنی هەر صیفەتێکدا خۆمان لەم چوار شتە بەدوور ئەگرین.

## ➢ قاعیدەی دووەم:

نەفیکردنی ئەو صیفەتانەی کە الله تعالی نەفی کردووە لەخۆی لە قورئانی پیرۆزدا یان پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم نەفی کردووە لە فەرموودەی صەحیحدا یان هاوەڵان رضي الله عنهم نەفی-یان کردووە لە ئەثەری صەحیحیدا، وە لەگەڵ نەفی کردنی هەر صیفەتێکدا کەمالی دژەکەی إثبات ئەکەین بۆ الله تعالی، چونکە نەفی کردنی هەر صیفەتێک بەبێ إثبات کردنی دژەکەی گەورەیی تیانیە بۆ خاوەنەکەی، بۆیە کاتێک نەفی زوڵم ئەکەین بۆ الله تعالی لەهەمان کاتدا إثباتی کەمالی عەدل ئەکەین بۆی، وە کاتێک نەفی مردن ئەکەین بۆ الله تعالی لەهەمان کاتدا إثباتی کەمالی ژیان ئەکەین بۆی، وە هەموو صیفەتێکی تری ناشایستە بە الله تعالی کە نەفی ئەکەین ئەبێ إثباتی کەمالی دژەکەی بکەین.

## ➢ قاعیدەی سێیەم:

صیفەتەکانی الله تعالی تەوقیفین لەڕێگای وەحیەوە ئەیزانین نەوەک بە ئیجتیهاد، بۆیە هیچ صیفەتێک لەخۆمانەوە إثبات ناکەین جگە لەوەی کە لە قورئان و فەرموودەی صەحیحدا إثبات کراوە، وە هیچ صیفەتێک لەخۆمانەوە نەفی ناکەین جگە لەوەی کە لە قورئان و فەرموودەی صەحیحدا نەفی کراوە.

## ➢ قاعیدەی چوارەم:

وەستان لە لەفزە موجمەلە (ناڕوونە) داهێنراوەکان، بەوەی لە سەرەتادا نە نەفی ئەکەین و نە إثباتی ئەکەین، بەڵکو ئەپرسین مەبەستت چیە لە بەکارهێنانی ئەم لەفزە داهێنراوە موجمەلە ؟ گەر ماناکەی ناشایستە بوو بە الله تعالی ئەوا نەفی ئەکەین، وە ئەگەر ماناکەی شایستە بوو بە الله تعالی و بەڵگەی شەرعی لەسەربوو ئەوا تەنها إثباتی ماناکەی ئەکەین نەک لەفزەکەی، وە پێی ئەڵێین واز لەم لەفزە موجمەلە داهێنراوە بهێنە لەشوێنی ئەودا لەفزی شەرعی بەکاربهێنە.

- **نموونە:**

**لەفزی (الجهة):**

کەسێک ئەم لەفزە بۆ الله بەکارئەهێنێ لەکاتێکدا لە بەڵگەی شەرعیدا نە نەفی کراوە نە إثبات، ئەڵێین مەبەستت چیە لە بەکارهێنانی لەفزی (الجهة) ؟ گەر ووتی: مەبەستم ئەوەیە (الجهة) شتێکی مەخلوقە دەوری الله تعالی داوە، ئەوا نەفی ئەکەین و ڕەتی ئەکەینەوە چونکە هیچ شتێک لە مەخلوقات دەوری الله تعالی نادات، الله لە دەرەوەی مەخلوقاتە لەسەر عەرشەکەیەتی، وە ئەگەر ووتی: مەبەستم لە (الجهة) ئەوەیە الله تعالی لە بەرزی ڕەهایە لە سەرووی ئاسمانەکانە لەسەر عەرش، واتا مەبەستم صیفەتی (العلو)ە، ئەوا ئەوکات ماناکەی قبوڵ ئەکەین و إثباتی ئەکەین بەڵام پێی ئەڵێین ووشەی (العلو) بەکاربهێنە شەرعیە واز لەم ووشە داهێنراوە ناڕوونە بهێنە.

بەڵام گەر صیفەتێک ناشایستە وناشرین بوو نوقصانی تیابوو بۆ الله تعالی ئەوا دەست بەجێ ڕەتی ئەکەینەوە و نەفی ئەکەین ئەگەرچی لە قورئان و سوننەتدا نەفی نەکرابێ بە دیاریکراوی.

- **نموونە:**

**کەسێک پرسێ الله (نەخۆش) ئەکەوێ ؟**

لێرەدا ناڵێین لەفزی (نەخۆش) لە قورئان و سوننەتدا نەفی نەکراوە ئێمەش نەفی ناکەین، مادام صیفەتی (نەخۆشی) نوقصانی تیایە ئەوا شایستە نیە بە الله تعالی چونکە تەواوی صیفەتەکانی الله کەمالە، بۆیە نەفی ئەکەین.

## ➢ قاعیدەی پێنجەم:

هەر صیفەتێکی الله تعالی کە بە نەقلی صەحیح چەسپابێ ئەوا بێگومان موافقی عەقلی صەریحە، واتا عەقلی سەلیم بەلایەوە قورس نیە وناڵێ چۆن ئەبێ الله ئەم صیفەتەی هەبێ، چونکە هەموو صیفەتەکانی الله صیفەتی کەمالە هیچ کەم و کورتی و نارێکی تیا نیە تا بەلامانەوە قورس بێ إثباتی بکەین، بەڵام کە عەقڵێک سەلیم نەبوو پێی وایە نابێ الله ئەم صیفەتەی هەبێ چونکە وائەزانێ گەر إثباتی صیفەتەکەی کرد ئەوا تەشبیهی کردووە بە صیفەتی مەخلوقات.

## ➢ قاعیدەی شەشەم:

وازهێنان بەهەموو شێوەیەک لە زانینی (الكيفية) چۆنیەتی صیفاتەکان و بیر لێنەکردنەوەی، چونکە مەخلوقات هەرگیز ناتوانن چۆنیەتی صیفاتەکانی الله بزانن، الله تعالی چۆنیەتی صیفاتەکانی پێ ڕانەگەیاندووین تا قسەی تیادا بکەین یان وێنای بکەین لەمێشکماندا چونکە تۆ بیر لەهەر شتێک بکەیتەوە لەمێشکتدا ئەوا الله تعالی ئەو شتە نیە کە تۆ بیری لێ ئەکەیتەوە (ليس كمثله شئ) هیچ شتێک وەکو ئەو نیە، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە چۆنیەتی (الكيفية)ی صیفەتەکان بوونی نیە و نەفی ئەکەین، بەڵکو بوونی هەیە بەڵام ئێمە نایزانین چۆنە، الله تعالی تەنها خۆی ئەزانێ چۆنە، بۆیە ئێمە باسی چۆنیەتی ناکەین و بیری لێناکەینەوە.

## ➢ قاعیدەی حەوتەم:

هەموو ناوێک کە بە بەڵگەوە چەسپابێ بۆ الله تعالی ئەوا صیفەتێکی لەخۆ گرتووە، بەڵام صیفەت ناو لەخۆ ناگرێت.

- نموونە:

ناوی الرحمن صیفەتی الرحمة-ی لەخۆگرتووە

ناوی الخالق صیفەتی الخلق-ی لەخۆگرتووە

ناوی الكريم صیفەتی الكرم-ی لەخۆگرتووە

هەموو ناوێکی تری الله تعالی بەهەمان شێوە.

بەڵام صیفەتی الإرادة یان الاستواء یان الإتیان و...هتد، ناتوانین ناوی لێ دەربهێنین، واتا ناتوانین بڵێین مادام الله تعالی صیفەتی الإرادة-ی هەیە کەواتە ناوی المريد-ە، مادام صیفەتی الاستواء-ی هەیە کەواتە ناوی المستوي-ە.

## ➢ قاعیدەی هەشتەم:

صیفەتەکانی الله بەگوێرەی پەیوەست بوون و نەبوونی بە ذاتی الله ئەبن بە دوو جۆر: (صیفەتە ذاتیەکان) و (صیفەتە فعلیەکان)

### صیفەتە ذاتیەکان:

پەیوەستن بەزاتی الله و هەرگیز لە زاتی الله دانابڕێن ئەزەلی و ئەبەدین، وەک صیفەتەکانی: (العلم ، القوة ، العزة ، الحكمة ، اليد ، الوجه ، العين ...هتد) لە ئەزەلەوە الله تعالی ئەم صیفەتانەی هەیە، وە بەردەوام پێی وەصف ئەکرێ.

- نموونە:

صیفەتی العلم: الله تعالی لە ئەزەلەوە صیفەتی عیلمی هەبووە و هەرگیز دانابڕێ لەزاتی الله.

### صیفەتە فعلیەکان:

پەیوەستن بەویستی الله کەی بیەوێ ئەنجامی ئەدات و کەی نەیەوێ ئەنجامی نادات، پەیوەست نین بەزاتی الله، واتا بەردەوام ڕوونادەن، وەک صیفەتەکانی: (الاستواء ، النزول ،

الاتيان ، الضحك ، الغضب ...هتد) هەریەکێک لە صیفەتە فعلیەکان فعلێکن وپەیوەستن بە ویستی الله، واتا دانە بەدانەی ئەم صیفەتانە نوێن، وەک صیفەتە زاتیەکان ئەزەلی نین، بەڵام چونکە فعلی الله صیفەتێکی ئەزەلیە واتا الله تعالى هەر لە ئەزەلەوە صیفەتی فعلی هەبووە و هەرگیز دانەبڕاوە لە فعل بۆیە ئەصلەکەیان ئەگەڕێتەوە بۆ صیفەتێکی ئەزەلی کە صیفەتی فعلە، ئەگەرچی دانە بەدانەی فعلەکان نوێن.

- **نموونە :**

صیفەتی الاستواء: کاتێک الله تعالى ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد پاشان بەرز بوویەوە بۆ سەر عەرش (إن ربكم الله الذي خلق السموات والأرض في ستة أيام ثم استوى على العرش) واتا دوای دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی استوای کردووە نەوەک هەر لە ئەزەلەوە صیفەتی استوای هەبێ، بۆیە وەکو جۆر و خودی (استوی) فعلێکی نوێیە پێشتر بوونی نەبووە، بەڵام خودی (فعل) صیفەتێکی ئەزەلی الله تعالى یە.

**وە هەندێک صیفەت هەیە لەڕووێکدا زاتیە و لەڕووێکدا فعلیە:**

- **نموونە:**

صیفەتی الكلام: الله تعالى لە ئەزەلەوە صیفەتی کەلامی هەبووە لەم ڕووەدا ئەزەلیە، بەڵام بەردەوام قسە ناکات بەڵکوکەی ویستی قسە ئەکات وکەی نەیویست قسە ناکات لەم ڕووەدا فعلیە.

## پوختەی بابەت:

ئەو صیفەتانەی پەیوەستن بە زاتی الله و بەردەوامن و هەرگیز دانابڕین لە زاتی الله ئەوا

صیفەتی زاتین، وە ئەو صیفەتانەی کە پەیوەستن بەویستی اللە کەی ویستی ئەنجامی ئەدات صیفەتی فعلین.

## ➢ قاعیدەی نۆیەم:

صیفەتەکانی اللە تعالى بەگوێرەی بەڵگەی ثابت بوونیان ئەبن بە دوو جۆر:

**١. صیفەتە نەقلیەکان (نقلیة أو سمعیة أو خبریة):**

ئەو صیفەتانەن کە لەڕێگای وەحیەوە ئەیانزانین ناتوانین لەڕێگای عەقل و فیطرەت بیزانین، وەکو: (الاصابع ، النزول ، الضحك ، الیدین ...هتد).

**٢. صیفەتە نەقلیەکان و عەقلیەکان (سمعیة عقلیة):**

ئەو صیفەتەتانەن کە لەڕێگای وەحیەوە ئەیانزانین بەهەمان شێوە بەهۆی عەقل و فیطرەتەوە ئەتوانرێ بیزانین، وەکو: (العلم ، القدرة ، العلو، الخلق ... هتد).

## ➢ قاعیدەی دەیەم:

بەڵگەکان لەسەر إثبات کردنی صیفەتەکانی اللە تعالى بە سێ جۆر هاتوون لە قورئان و سوننەتدا:

١. بەڕاشکاوی باسی صیفەتەکە ئەکات، وەکو: (الرحمة ، القوة ، الوجه ، العزة ...هتد).

٢. ناوەکە صیفەتەکەی لەخۆگرتووە، وەکو: (ناوی البصیر صیفەتی البصر-ی لەخۆگرتووە، ناوی السمیع صیفەتی السمع-ی لەخۆگرتووە، ناوی الکریم صیفەتی الکرم-ی لەخۆگرتووە ...هتد).

٣. فعلێک یان وەصفێک ئاماژەیە بۆ صیفەتەکە، وەکو: (الرحمن على العرش استوى) استوى فعله بەڵگەیە لەسەر صیفەتی الاستواء، (إنا من المجرمين منتقمون) منتقمون وەصفە بەڵگەیە لەسەر صیفەتی الانتقام (تۆڵە کردنەوە) لە موجریمین.

## ➢ قاعیدەی یانزەم:

صیفەتەکانی الله تعالى عیبادەت و دوعایان پێ ناکرێ، بەڵکو عیبادەت و دوعاکردن بە ناوەکانی الله تعالى ئەکرێ، وەک الله فەرموویەتی: (ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها).

ئەڵێین: (عبدالرحمن ، عبدالکریم ، عبدالحکیم ...هتد) بەڵام ناڵێین (عبدالرحمة ، عبدالکرم ، عبدالحکمة ...هتد).

هەروەها لە دوعاکردندا ئەڵێین: (یا رحمن ارحمنا ، یا کریم اکرمنا ، یا لطیف الطف بنا ...هتد) بەڵام ناڵێین (یا رحمة الله ارحمینا ، یا کرم الله اکرمنا ، یا لطف الله الطف بنا ...هتد) چونکە ئەمە داواکردن وپاڕانەوەیە لە صیفەتی الله نەوەک لەزاتی الله ئەمەش ئەبێتە شیرك، بەڵکو ئەبێ لە زاتی الله بپاڕێینەوە و داوا لەو بکەین بە ناوە جوانەکانی هەروەک خۆی فەرموویەتی.

بەڵام ئەکرێ وەکو (توسل) لە دوعاکردندا صیفەتەکانی الله تعالى وەکو توسلێکی شەرعی بەکاربهێنین، بەڵگەش لەسەرئەمە:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (اللهم أعوذ برضاك من سخطك وبمعافاتك من عقوبتك) [صحيح مسلم: 486]، لەم فەرموودەیەدا ئەبینین پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم صیفەتی (الرضا و المعافاة=العفو) وەکو توسل بەکارهێناوە لە (الاستعاذة)دا کە جۆرێکە لە دوعاکردن، نەوەک داوا لە صیفەتی ڕەزامەندی و عەفوی الله بکات.

هەروەها دروستە سوێند بخورێ بە صیفەتەکانی الله تعالى، البخاري لە صەحیحەکەیدا بابێکی داناوە بەناوی (باب الحلف بعزة الله وصفاته وكلماته) سوێند خواردن بە عیززەت و صیفات و کەلامی الله، وە لە ژێریدا ئەم فەرموودەیەی هێناوە کە دۆزەخ سوێند ئەخوات بە عیززەتی الله.

قال النبي صلى الله عليه وسلم: (لا تزال جهنم تقول هل من مزيد حتى يضع رب العزة فيها قدمه فتقول قط قط وعزتك) [صحيح البخاري: 6284].

وە هەندێک زانا ئەڵێن تەنها دروستە سوێند بە صیفاتی زاتی بخورێ، دروست نیە سوێند بە صیفاتی فعلی بخورێ، والله أعلم بالصواب.

## ➢ قاعیدەی دوانزەم:

قسەکردن دەربارەی صیفاتەکانی الله وەک قسەکردن وایە دەربارەی زاتی الله، هەروەک چۆن زاتی الله زاتێکی حەقیقیە لەهیچ زاتێکی تر ناچێ، بەهەمان شێوە صیفەتەکانی الله صیفاتی حەقیقین لە صیفاتی مەخلوقات ناچن، وە هەروەک چۆن إثبات کردنی زاتی الله إثبات کردنی وجودیەتی نەوەک باسکردنی چۆنیەتی زاتەکە (الكيفية) بەهەمان شێوە إثبات

کردنی صیفاتەکانی الله إثبات کردنی وجودی صیفەتەکەیە نەوەک باسکردنی چۆنیەتی صیفەتەکە.

## ➢ قاعیدەی سێنزەم:

قسەکردن دەربارەی هەندێک صیفاتی الله وەک قسەکردن وایە دەربارەی تەواوی صیفەتەکانی تری الله بەبێ جیاوازی، هەروەک چۆن صیفەتی (العلم و القدرة و الخلق و الرحمة) إثبات ئەکەین، بەهەمان شێوە صیفەتی (الوجه و الید و الضحك و الفرح) إثبات ئەکەین، نەوەک هەندێکی إثبات بکەین و هەندێکی ڕەت بکەینەوە یان تەئویل بکەین.

## ➢ قاعیدەی چواردەم:

هەر شتێک درایە پاڵ الله و جیانەبوو لە الله ئەوا صیفەتی الله یە و مەخلوق نیە، وە هەر شتێک درایە پاڵ الله و جیابوو لە الله ئەوا صیفەتی الله نیە و مەخلوقە، مەرج نیە هەر شتێک درایە پاڵ الله صیفەتی الله بێ.

- **نموونە:**

(حتی یسمع کلام الله) "کلام" صیفەتی الله یە چونکە جیانیە لێی.

(ناقة الله وسقیاها) "ناقة" صیفەتی الله نیە چونکە جیایە لێی، بەڵکووەک ڕێزلێنان داویەتیە پاڵ خۆی.

## ➢ قاعیدەی پانزەم:

لە بابەتی الأسماء والصفات و تەواوی بابەتەکانی تری عەقیدەدا گەر تەنها یەک فەرموودە هاتبێ و تەنانەت ئاحادیش بێ، بەو مەرجەی صەحیح بێ ئەوا ئەبێتە بەڵگە و قبوڵ ئەکرێ، بەپێچەوانەی ئەوگروپانەی ترکە فەرموودەی ئاحاد وەرناگرن لە بابەتی عەقیدەدا.

## ➢ قاعیدەی شانزەم:

صیفەتەکانی الله تعالی ماناکانیان زانراوە، بە حەقیقی ماناکانیان وەرئەگرین، بەبێ مەجازو استعارة، ئەڵێین (ید) واتا دەست (النزول) واتا دابەزین، (الضحك) واتا پێکەنین ...هتد، ماناکانیان ناگۆڕین، بە بیانووی مەجاز و استعارة نەفی و تەئویلی صیفەتەکان ناکەین.

## ➢ قاعیدەی حەڤدەم:

بابەتی هەواڵدان (الاخبار) دەربارەی الله تعالی فراوانترە لە بابەتی (الأسماء والصفات)، ناوەکان و صیفەتەکانی الله تەوقیفین واتا لەڕێگای وەحیەوە إثبات ئەکرێن ناتوانین لەخۆمانەوە ناوێک یان صیفەتێک بدەینە پاڵ الله. بەڵام وەک هەواڵدان دەربارەی الله دروستە هەندێک ووشە بەکاربهێنین بۆی ئەگەرچی بەڵگەشی لەسەر نەهاتبێ چونکە بابەتی هەواڵدان مەرج نیە تەوقیفی بێ.

• **نموونە:**

**(الشيء ، الذات ، القديم) ئەم ووشانە بۆ الله بەکاردێنین تەنها وەک هەواڵدان (الاخبار) دەربارەی الله نەوەک وەکو ناو یان صیفات، ئەگەرچی بەڵگەشیان لەسەرهاتبێ یان نەهاتبێ بەو مەرجەی ووشەی ناشرین و ناشایستە نەبن ئەگەرچی ووشەکە مەدح و گەورەییشی تیانەبێ.**

## ➢ قاعیدەی هەژدەم:

**صیفەتەکانی الله تعالی قیاس تیایدا بەکارنایەت، ووشەی (المعرفة) قیاس ناکرێتە سەر صیفەتی (العلم)، ووشەی (الاستطاعة) قیاس ناکرێتە سەرصیفەتی (القدرة) ...هتد.**

## ➢ قاعیدەی نۆزدەم:

**قیاس نەکردنی صیفەتەکانی الله تعالی لەسەر صیفەتی مەخلوقات، هەروەک چۆن صیفەتی الله لە صیفەتی مەخلوقەکانی ناچێ، ئەڵێین بیستنی الله وەکو بیستنی مەخلوقات نیە، بەهەمان شێوە لەڕووێکی تریش ئەبێ نەفی لەیەکچواندن و قیاس بکەین، وەک لەم نموونەیەی خوارەوەدا هاتووە.**

• **نموونە:**

**مەخلوقات لەڕێگای (گوێ) ئەبیستن، بەڵام لە خۆمانەوە ناڵێین: الله تعالی مادام ئەبیستێ**

کەواتە (گوێ)ی هەیە، چونکە ئەبێتە قیاس کردن و لەیەکچواندنی صیفەتی خالق و صیفەتی مەخلوق، لەبەر ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا باسی (گوێ) نەکراوە بۆ الله تعالى ئێمەش نە نەفی ئەکەین و نە إثباتی ئەکەین، تەنها ئەڵێین الله صیفەتی بیستنی هەیە و ئەبیستێ بەبێ إثبات کردنی گوێ، بەڵام مادام سیفەتی چاو بۆ الله إثبات کراوە لە قورئان و سوننەتدا ئەڵێین ئەبینێ بە چاو، بینینێک شایستەیە بە زاتی خۆی نایچوێنین بە بینینی مەخلوقات.

## ➢ قاعیدەی بیستەم:

ئەو صیفەتانەی کە لە قورئان و سوننەتدا بە مقییدی هاتوون ئێمەش بە مقییدی إثباتی ئەکەین نەوەک بە مطلقی، چونکە گەر بە مطلقی بدرێنە پاڵ الله ئەبن بە نەقص بۆی سبحانە وتعالى، بەڵام گەربە مقییدی بدرێتە پاڵی بەرامبەرئەوکەسانەی کە شایستەن ئەوا ئەبن بە صیفاتی کەمال بۆی.

- **نموونە:**

صیفەتی مکر (ومكروا ومكر الله)

صیفەتی کید (إنهم يكيدون كيدا - وأكيد كيدا)

صیفەتی خداع (يخادعون الله وهو خادعهم)

صیفەتی الاستهزاء (إنما نحن مستهزءون - الله يستهزئ بهم)

صیفەتی سخرية (فيسخرون منهم سخر الله منهم)

هەروەک ئەبینین ئەم صیفەتانە لە تەواوی ئایەتەکاندا بە مقییدی هاتوون نەوەک بە مطلقی، بەرامبەر ئەو کەسانە الله ئەم صیفەتانەی هەیە کە شایستەی ئەوەن و خۆیان ئەم صیفەتەیان دژی موسڵمانان بەکارهێناوە، بەکارهێنانی ئەم صیفەتانە بەرامبەرکەسێک کە شایستە نیە ئەبێتە زوڵم، بەڵام بەکارهێنانی بەرامبەر کەسێک کە شایستەیە ئەوا ئەوپەڕی حیکمەت و عەدالەت و کەمالی الله نیشان ئەدات.

## ➢ قاعیدەی بیست ویەکەم:

صیفەتەکانی الله ناژمێردرێن چونکە الله تعالی صیفەتی ذاتی و فعلی هەیە، هەرفعلێکی الله صیفەتێکە (والله یفعل ما یشاء)، هەروەها قەولی زۆرینەی زانایان ئەوەیە کە ناوەکانی الله تعالی ناژمێردرێن.

ئەگەرچی لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە (إن لله تسعة وتسعين اسما مائة إلا واحدا) [متفق عليه] هەروەک ابن حزم کردوویەتی بە بەڵگە کە لەم ٩٩ ناوە زیاترنیە، بەڵام زۆرینەی زانایان ئەڵێن ناوەکانی الله ناژمێردرێن و لە ٩٩ زیاترن، وە هەر ناوێکیش صیفەتێکە کەواتە صیفەتەکانیش لەژماردن نایەن، بەڵگەی زۆرینەشیان ئەم فەرموودەیە (أسالك بكل اسم هو لك سميت به نفسك أو أنزلته في كتابك أو علمته أحداً من خلقك أو استأثرت به في علم الغيب عندك) واتا الله تعالی هەندێک ناوی هەیە کە غەیبیە بە کەسی ڕانەگەیاندووە، بەڵام ئەم فەرموودەیە زەعیفە لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەیەکی تر هەیە کە ابن تيمية بەڵگەی پێ هێناوەتەوە بەوەی ناوەکانی الله ناژمێردرێن ئەویش فەرموودەی: (لا أحصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك) [صحيح مسلم: 486]، (لا أحصي ثناء عليك) واتا ناتوانم

وپێم ناژمێردرێ مەدح وسەنای تۆ، مەدح وسەنای الله تعالى بە ناووصیفەتەکانی ئەکرێ، والله أعلم بالصواب.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين